# سەد فەرموودەی صەحیح بۆ لەبەرکردن




ئامادەکردنی:

مكتبة الإمام الوادعي

وەرگێر: زریان سەرچناری

پێداچوونەوە: مامۆستا عطا الأثری

چاپی یەکەم

١٤٣٥ کۆچی




238
posts

19.2k
followers

7
following

Promote

Edit Profile

پەرەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆرایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_



Ktebi_PDF














# سەد
# فەرمودەی صەحیح
# بۆ لەبەرکردن

ئامادەکردنی/ مکتبة الامام الوادعي

**وەرگێڕ/ زریان سەرچناری**

**مائة حديث**

**الصحيحين**

1OO hadith





بسم الله الرحمن الرحيم

# سەد فەرمودەی صەحیح
# بۆ
# لەبەرکردن

## (مائة حديث للحفظ مما ورد في الصحيحين)

ئامادەکردنی/ مكتبة الامام الوادعي

وەرگێڕ/ زریان سەرچناری

پێداچونەوەی / مامۆستا عطا الأثرِي

( پێشنوێژو وتارخوێنی /

مزگەوتی شەهیدان لە پێنجوێن )

بۆ دەست کەوتنی ئەم نامیلکەیە

سەروانی ( تۆمارگەی سوننە ) لە سلێمانی ـ شەقامی مەولەوی ـ بازاری کەنار

٠٧٧٠٣٦٧٥١٤١ :

إخلاص النية لله جل جلاله

## پاككردنەوەی نیەت بۆ خوا

١-عنْ عُمر بْن الْخطَّاب(رضي الله عنه) قال: سمعْتُ رسُول اللّه(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) يقُولُ: إنَّما الأعْمالُ بالنِّيات، وإنَّما لكل امرئٍ ما نوى، فمنْ كانتْ هجْرتهُ إلى اللّه ورسُوله فهجْرتهُ إلى اللّه ورسُوله، ومنْ كانتْ هجْرتُهُ لدُنيا يُصيبُها، أو امْرأة ينْكحُها فهجْرته إلى ما هاجر إليه ".مُتّفقٌ عليه

واتە: عومەری كوڕی خەتاب(رضي الله عنه) دەفەرموێت: گوێم لە پێغەمبەری‌خوا بوو(صَلَى الله عَلَيهِ وَعَلَى آله وسَلَم) دەیفەرموو: بەڕاستی پاداشتی كردەوەكان بەگوێرەی نیەتی ناودڵە، بۆیە هەموو كەسێك بەگوێرەی نیەتی ناودڵی پاداشت وەردەگرێت، هەركەسێك كۆچكردنەكەی (لە شاری مەككەوە بۆ شاری مەدینە) لەبەر خواو پێغەمبەری‌خوا(صَلَى الله عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَم) بێت ئەوا كۆچكردنەكەی لەبەر خواو پێغەمبەری‌خوایە(صَلَى الله عَلَيه وَعَلَى آله وسَلَم) و (پاداشتەكەی بەگوێرەی ئەوە وەردەگرێت) وە هەر كەسێك كۆچكردنەكەی بۆ بەدەست هێنانی ماڵی دنیا بێت، ئەوا بەدەستی دەهێنێت و (پاداشت وەرناگرێت لەسەری) یان بۆ ئەوە كۆچ بكات (بۆ شاری مەدینە) كە لەوێ ئافرەتێك مارەبكات (بەهەمان شێوە پاداشت وەرناگرێت لەسەری) كەواتە هەركەسەو كۆچكردنەكەی بۆ ئەوەیە كە خۆی مەبەستێتی. (پاداشتەكەشی هەر بە گوێرەی مەبەستەكەی خۆیەتی).

احذر الشرك بالله جل جلاله

## ئاگاداربە نەكەویتە شیركەوە

٢-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنه) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولُ اللَّه (صَلَى الله عَلَيه وَعَلَى آله وَسَلَم) يَقُولُ: « قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ». رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: پێغەمبەری‌خوا(صَلَى الله عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَم) فەرمویەتی: خوای‌گەورە دەفەرموێت: من لە هەمو شەریكەكان بێ پێویست ترم لە شەریك، بۆیە هەركەسێك كارێك (بۆ من) ئەنجامبدات و بەشی شەریكێكیشی تێ بكات ئەوا من واز لەو كارە دەهێنم بۆ شەریكەكە.

راقب قلبك وأخلص عملك

## چاودێری دڵت بكه و كردهوهكانت پاكبكهرهوه

٣-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّىَ الله عَلَيه وَعَلَىَ آله وَسَلَم)« إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَامِكُمْ ولا إِلى صُوَرِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ ». رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واته پێغهمبهری‌خوا( صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فهرمويهتی: بهڕاستی خوای‌گهوره (بۆ ههڵسهنگاندنتان) تهماشای شێوهو شكڵتان ناكات، وهههروهها تهماشای لهشولاريشتان ناكات، بهڵكو تهماشای دڵ و كردهوهكانتان دهكات.

مداومة الاستغفار

## بهردهوامبون لهسهر تۆبهكردن

٤-عَنْ الأَغَرِّ بنِ يسار المزنيِّ (رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)« يَا أَيُّهَا النَّاسُ تُوبُوا إِلَى اللَّه واستغفروه، فَإِنِّي أَتُوبُ فِي الْيَوْمِ مائَةَ مَرَّةٍ ». رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واته: پێغهمبهری‌خوا( صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فهرمويهتی: ئهی خهڵكينه تهوبهبكهن و بگهڕێنهوه بۆلای خوای‌گهوره، من خۆم لهڕۆژێكدا "سهد" جار تهوبهدهكهم.

باب التوبة مفتوح

## دهرگای تهوبهكردن كراوهيه

٥-عَنْ أَبِي مُوسَى ألأشْعَرِيُ(رَضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) قَالَ « إِنَّ اللَّهَ تعالى يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا ». رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واته: پێغهمبهری‌خوا( صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فهرمويهتی: خوای‌گهورهو ميهرهبان بهشهودا دهستی والآدهكات بۆ ئهوهی لهو خراپهكارانه خۆشبێت كه لهڕۆژدا خراپهيان كردووه، وه بهڕۆژيشدا دهستی والآدهكات بۆ ئهوهی لهو خراپهكارانه خۆشبێت كه لهشهودا خراپهيان ئهنجامداوه (بهم شێوه لێخۆشبون بهردهوامه) تاكو ئهو ڕۆژهی خۆر لهخۆر ئاوادا ههڵدێت. (واتا تاكو ڕۆژی قيامهت.)

من فضائل الاعمال

## هەندێك لە كردەوەچاكان

٦-عَنْ أَبِي مَالِكٍ الحارث بن عاصم الأَشْعَرِيِّ(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّىَ الله عَلَيه وَعَلَىَ آله وَسَلَّم)« الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ للَّه تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّه وَالْحَمْدُ للَّه تَمْلآنِ -أَوْ تَمْلأُ- مَا بَيْنَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا ». رَوَاهُ مُسْلِمٌ (مُوبِقٌ: المُهْلِكُ: **لەناوبەر**)

واتە: پێغەمبەری‌خوا(صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَّم) فەرمویەتی: پاکو تەمیزی بەشێکە لەئیمان وە گوتنی " الْحَمْدُ لِلَّهِ " تای تەرازوی باشە پڕدەکات، وە " سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ " نێوانی ئەرزو ئاسمان پڕ دەکەن، نوێژ نورو ڕوناکیە،ماڵبەخشین بەڵگەیە (لەسەر ڕاستێتی ئیمان) ئارامگرتن ڕۆشنایيە، قورئانیش بەڵگەیە بەدەستەوە یان دەبێتە بەڵگە بەسەرتەوە، هەموکەس بەیانیان کەلەماڵ دەچێتەدەر (وەك ئەوە وایە) نەفسی بفرۆشێت، جا یان (نەفسی خۆی دەفرۆشێت بە خوای خۆی) ئازادی دەکات یان نەفسی خۆی (دەفرۆشێت بە شەیتان) لەناوی دەبات.

إصبر على الاذى

## ئارامبگرە لەسەر ناڕەحەتی

٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنهما)عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّىَ الله عَلَيه وَعَلَىَ آله وَسَلَّم) قَالَ: مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ، وَلَا وَصَبٍ، وَلَا هَمٍّ، وَلَا حَزْنٍ، وَلَا أَذًى، وَلَا غَمٍّ، حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشَاكُهَا إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ. مُتَّفَقٌ عَلَيهِ (النَّصب: التعب: **ماندوبون**، الوصب: الألم والسقم الدائم: ئازارو نەخۆشی درێژخایەن).

واتە: پێغەمبەری‌خوا(صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَّم) فەرمویەتی: هەر بێ تاقەتی و نەخۆشی و خەفەت و ئازارو غەمێك کەتوشی موسوڵمان دەبێت، تەنانەت ئەگەر دڕکێکی تێهەڵچەقێ، ئەوا بەهۆیانەوە خوای‌گەورە لەتاوانەکانی دەسڕێتەوە.

## لا تغضب

## توڕەمەبە

٨ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنه) أَنَّ رَسُولُ الله (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) قَالَ: «لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ.» مُتَفَقٌ عَلَيهِ

واتە پێغەمبەری خوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم ) فەرمویەتی: بەهێز ئەوکەسە نییە کە لەزۆرانبازیدا بەتوانایە و (بەسەر خەڵکدا سەردەکەوێت) لە ڕاستیدا بەهێز ئەوکەسەیە (بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ دەبێت) و کاتی توڕەبون دان بەخۆیدادەگرێت.

## إلزم الصدق

## بەردەوامبە لەسەر ڕاستگۆیی

٩ـعَنْ إ بْنِ مَسْعُود(رَضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) قَالَ: « إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِى إِلَى البِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِى إِلَى الْجَنَّة، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّه صِدِّيقًا. وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِى إِلَى فُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِى إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّاباً.» مُتَفَقٌ عَلَيهِ

واتە پێغەمبەری خوا (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم ) فەرمویەتی: ڕاستگۆیی ڕێنمایی کەرە بۆ چاکەکاری، وە چاکەکاریش ڕێنمایی کەرە بۆ چونە بەهەشت، کەسی واهەیە هەمیشە ڕاسگۆیە تاکو لای خوایگەورە بە ڕاستگۆ ناونوس دەکرێت، وە درۆ ڕێنمایی کەرە بۆ خراپەکاری وە خراپەکاریش ڕێنمایی کەرە بۆ چونە دۆزەخ کەسی واهەیە بەردەوام درۆدەکات تاکو لای خوا بە درۆزن ناونوس دەکرێت.

## لا تضيِّع النعم

## نیعمەتەکان لەدەست مەدە

١٠ـعَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم): نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ. رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: دوو نیعمەت هەن زۆربەی خەڵك لێیان بێ ئاگان (بە گوێرەی پێویست سودیان لێ نابینن) کە بریتین لە: تەندروستی و دەست بەتاڵی.

الاجتهاد في الطاعة

## كۆششکردن لەگوێڕایەڵی خوایگەورەدا

١١- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضي الله عنه) مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيه وَعَلَى آله وَسَلَّم) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَّم)يَقُولُ: « عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ، فَإِنَّكَ لَنْ تَسْجُدَ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلاَّ رَفَعَكَ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَةً.»رَوَاهُ مُسْلِم

واتە: گوێم لە پێغەمبەریخوا بوو(صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَّم) دەیفەرموو: زۆر سوژدە بەرە بۆ خوا، چونکە بەهەر سوژدەیەك كە دەیبەیت، خوایگەورە پلەیەك بەرزت دەكاتەوەو هەڵەیەكیشت دەسڕێتەوە.

الاعمال بالخواتيم

## کردەوەکان بە گوێرەی کۆتاییەکانیانە

١٢- عَنْ جَابِرٍ(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَّم)« يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ.» رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واتە: پێغەمبەریخوا(صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلهِ وَسَلَّم) فەرمویەتی: هەموو بەندەیەك لەسەر كۆتایەمین كردەوەی زیندو دەكرێتەوە كە لەسەری مردووە.

لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا

## هیچ چاکەیەك بە کەم سەیر مەکەن

١٣- عَنْ أَبِى ذَرٍّ(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ لِىَ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَّم)« لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ.» رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واتە: پێغەمبەریخوا(صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلهِ وَسَلَّم) فەرمویەتی: هیچ كردەوەیەكی چاك بەكەم تەماشەمەكەن و (پێتان وابێت پاداشتی كەمە، بەڵكو چاوەڕێی ئەجرو پاداشتی زۆربن بە ئەنجامدانی كردەوەی كەمیش) ئەگەر تەماشاكردنی برا موسوڵمانەكەشت بێت بەڕویەكی خۆشەوە.

استعنْ باللّه تعالى

## پشت بەخوا ببەستە

١٤-عَنْ أبي هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه (صَلَى الله عَلَيه وَعَلى آلِه وَسلم)« الْمُؤمِنُ القَوِيُّ خَيْرٌ وَأحبُّ إلى اللّه مِن الْمُؤمِن الضَعيف وَفي كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ عَلى مَا يَنْفَعُك. وَاسْتَعِنْ بِاللّه، وَلاَ تَعْجِزْ وَإنْ أصابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ لَوْ أنّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذا. وَلكِنْ قُلْ قَدرُ اللّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشّيْطَانِ ». رَوَاهُ مُسْلِم

واتە: پێغەمبەری‌خوا(صَلَى الله عَلَيه وَعَلَى آلِه وَسَلَم) فەرمویەتی: ئیمانداری بەهێز و (خۆڕاگر) باشترە لە ئیمانداری لاواز هەرچەندە هەردوکیان هەر خێرو چاکەیان تێدایە، (جا بۆ ئەوەی ببیت بە یەکێك لە ئیماندارە بە هێزەکان) سوربە لەسەر ئەو شتەی سودت پێدەگەیەنێت (نەکەی بەخۆت بنازیت) تەنها پشت بەخوا ببەستە و کۆڵنەدەربە، ئەگەر شتێکی ناخۆشت هاتە ڕێ (مەکەوەرە گلەیی)و مەڵێ ئەگەر وام بکردایە واو وا دەبوو، بەڵکو بڵێ: " قَدَرُ اللّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ " ئەوەی بەسەرم هات قەدەری خوابوو چی ویستی لێبێت دەیکات، چونکە وشەی (ئەگەر) واتا (ئەگەر وام نەکردایە وا نەدەبوو) دەرگا بۆ شەیتان دەکاتەوە (کە بچێتە دالْغەی مرۆڤ و لە بری هەوڵدان دابنیشێت و هەر سەرزەنشتی خۆی یان دەورو بەرەکەی بکات).

المؤمن بين الشُكر والصبر

## ئیماندار لە نێوانی شوکرانەبژێری و ئارامگرتندایە

١٥-عَنْ صُهَيْبِ بنِ سنان(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه (صَلَى الله عَلَيه وَعَلَى آله وَسَلَم)« عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤمِنِ إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ له خَيْرٌ وَلَيْسَ ذَالكَ لأحَد إلاّ لِلْمُؤمِن: إنْ أصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإنْ أصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ ». رَوَاهُ مُسْلِم

واتە پێغەمبەری‌خوا (صَلَى الله عَلَيه وَعَلَى آلِه وَسَلَم فەرمویەتی: سەرسامی لە کاری ئیمانداردا هەیە، کاروکردەوەکانی هەموی بۆی دەبنە مایەی خێرو چاکە، ئەمەش بۆ کەس نییە جگە لەئیماندار، چونکە ئەگەر توشی خۆشیەك ببێت شوکری خوای لەسەردەکات، دەبێتە مایەی خێر بۆی، وەئەگەر ناخۆشیەکی توش بێت ئارام دەگرێت لەسەری، ئەمیش هەر بۆی دەبێتە مایەی بەدەستهێنانی چاکە.

## بەشەکانی باوەڕ

١٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ،(رَضي الله عنه) عَنِ النَبيِّ(صَلَىَ الله عَلَيه وَعَلَىَ آله وَسَلَم) قَالَ: « الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ -أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ- شُعْبَةً: فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ ». مُتَفَقٌ عَلَيه

واتە پێغەمبەریخوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آلهِ وَسَلَم) فەرمویەتی: ئیمان پێکهاتووە لە حەفتاو ئەوەندە بەش "یان شەست و ئەوەندە بەش" باشترین بەشی بریتیە لە گوتنی "لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ" وە بچوکترین بەشی بریتیە لە لابردنی نارەحەتیەك لەسەرە ڕێگایەکدا، وە شەرم و حەیا بەشێکە لە باوەڕ.

من مُكفرات الذنوب

## هەندێك لە شۆرەرەوەی تاوانەکان

١٧-عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّه (صَلَىَ الله عَلَيه وَعَلَىَ آله وَسَلَم)قَالَ: « الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ». رَوَاهُ مُسْلِم

واتە: پێغەمبەریخوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آلهِ وَسَلَم) فەرمویەتی: پێنج نوێژە فەرزەکان، و نوێژی جومعە بۆ جومعە، بەڕۆژو بونی مانگی ڕەمەزان بۆ ڕەمەزانێکی تر، هۆی سڕینەوەی تاوانن بەمەرجێك لە گوناهە هەرەگەورەکان نزیك نەبیتەوە.

من اسباب رضا الله

## لە هۆکارەکانی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا

١٨-عَنْ أَنَسٍ(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَىَ الله عَلَيه وَعَلَىَ آله وَسَلَم):« إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا ». رَوَاهُ مُسْلِم

واتە: پێغەمبەریخوا (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آلهِ وَسَلَم) فەرمویەتی: بەڕاستی خوایگەورە لەو بەندەیەی خۆی ڕازی دەبێت کاتێك شتێك دەخوات سوپاسی خوا دەکات لەسەری، وەکاتێك شتێك دەخواتەوە سوپاسی خوا دەکات لەسەری.

النهي عن كثرة السؤال

## ڕێگری لە پرسارکردنی زۆر

١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنه)، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آلِه وَسَلَم) قَالَ: دَعُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، إِنَّمَا أَهلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كثرة سُؤَالِهِمْ وَاختِلافُهُمْ عَلَى أَنبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ. مُتَّفَقٌ عَلَيهِ

واتە پێغەمبەریخوا(صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آلِه وَسَلَم) فەرمویەتی: چیم بۆ باسکردن وازبێنن و (زۆر پرسیار مەکەن دەربارەی) بەڕاستی نەتەوەکانی پێش ئێوە بەهۆی ئەوەوە لەناوچون پرسیاری زۆریان دەکرد لە پێغەمبەرەکانیان (ئەوەی دەیانبیست نەیاندەتوانی جێبەجێیبکەن) جیازوازی پێغەمبەرەکانیان دەکردتیایدا (ئێوە بۆئەوەی وەك ئەوانتان لێ نەیەت) هەرچیم لێ قەدەغەکردن توخنی مەکەون وەهەر فەرمانێکم پێکردن بە گوێرەی توانای خۆتان جێبەجێی بکەن.

النهي عن البدع

## ڕێگری شت داهێنان لە دیندا

٢٠- عَنْ عَائشَةَ(رَضي الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آلِه وَسَلَم)« مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ ».مُتَّفَقٌ عَلَيهِ

واتە پێغەمبەریخوا(صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آلِه وَسَلَم) فەرمویەتی: هەرکەس هەرچی دابهێنێت لەم دینەماندا (شتێکی بۆ زیاد بکات) کە تیایدا نەبێت ئەوە (لە لایەن خوایگەورەوە لێی وەرناگیریت) و ڕەت کراوەیە.

الدال على الخير كفاعله

## هەرکەس ببێتە ڕێنیشاندەر بۆ کارێکی خێر پاداشتی وەك بکەرەکەیەتی

٢١- عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو الأَنْصَارِيِّ البدري(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آلِه وَسَلَم)« مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ ». رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واتە پێغەمبەریخوا(صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آلِه وَسَلَم) فەرمویەتی: هەرکەس ببێتە ڕێنیشاندەری خەڵك بۆ کاری خێر، ئەوا پاداشتی وەکو پاداشتی بکەرەکەی بۆدەنوسرێت. (بەبێ ئەوەی لە پاداشتی بکەرەکەش کەم ببێتەوە.)

الدِّينُ النَّصِيحَةُ

## ئایین ئامۆژگاری و -دڵسۆزیە-

٢٢-عَنْ تَمِيمِ بْنُ أَوْسِ الدَّارِيِّ(رَضِي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلِه وَسَلَّم)قَالَ « الدِّينُ النَّصِيحَةُ » قُلْنَا لِمَنْ؟ قَالَ: « لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ ». رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واته پێغەمبەری‌خوا(صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَعَلَىَ آلِه وَسَلَم) فەرمویەتی: ئەم ئاینەی ئێمە ئامۆژگاری و دڵسۆزیە. گوتمان بۆکێ؟ فەرموی: دڵسۆزی بۆ خواو قورئانەکەی و پێغەمبەرکەی، وە ئامۆژگاری‌کردنی پێشەوایان و سەرجەم موسوڵمانان.

المؤمنون إخوة

## ئیمانداران برای یەکترین

٢٣-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ(رَضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَعَلَىَ آلِهِ وَسَلَّم)قَالَ: « لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ .»مُتَّفَقٌ عَلَيهِ

واته پێغەمبەری‌خوا(صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَعَلَىَ آلِه وَسَلَم) فەرمویەتی: هیچ کامتان ئیمانی تەواونییە هەتا (دەگاتە ئەو پلەیەی) چی بۆخۆی پێ خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت. (هەروەها چی بۆ خۆشی پێ ناخۆشە بۆ براکەشی پێی ناخۆش بێت.)

المؤمنون جسد واحد

## ئیمانداران وەك یەك لاشە وان

٢٤- عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَعَلَىَ آلِه وَسَلَم): « مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ، مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى ». مُتَّفَقٌ عَلَيهِ

واته پێغەمبەری‌خوا(صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَعَلَىَ آلِه وَسَلَم) فەرمویەتی: نمونەی ئیمانداران لە لایەنی خۆشەویستی و سۆزو بەزەییان بۆ یەکتر وەکو یەکلاشە وان، ئەگەر یەك ئەندامی ئەو لەشە ناساغ بێت ئەوا هەموو لاشەکە توشی شەونخونی و "تا" دەبێت.

تغير المنكر

## شێوازەکانی گۆڕینی خراپە

٢٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري(رَضِيَ اللهُ عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم)يَقُولُ: « مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ. » رَوَاهُ مُسْلِم

واتە پێغەمبەری‌خوا(صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم) فەرمویەتی: هەرکەستان کارێکر خراپی بینی باهەوڵبدات بەدەست بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی باهەوڵبدات بە "دەم" بیگۆڕێت جا ئەگەر هەر نەیتوانی با لەدڵەوە پێی ناخۆش بێت ئەمەشیان لاوازترینی ئیمانە.

علامات المنافق

## نیشانەی دوو ڕووەکان

٢٦-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِيَ اللهُ عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم)قَالَ: آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ. وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ. مُتَّفَقٌ عَلَيهِ

واتە پێغەمبەری‌خوا(صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم) فەرمویەتی: نیشانە (سەرەکیەکانی) دووڕوو سێ دانەن، کەقسەدەکات درۆی پێوە دەنێت، وە کەبەڵێن و پەیمان دەدات نایباتەسەر، وە کەئەمانەتی لادادەنرێت خیانەت و ناپاکی تیادەکات.

اتقوا الظلم والشُح

## خۆتان بپارێزن لە ستەم و چاوچنۆکی

٢٧-عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ(رَضِيَ اللهُ عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم)قَالَ: « اتَّقُوا الظُّلْمَ فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا الشُّحَّ فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ ».رَوَاهُ مُسْلِم

واتە پێغەمبەری‌خوا(صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم) فەرمویەتی: خۆتان بپارێزن لە ستەمکردن (لە نەفسی خۆتان و دەوروبەرەکەتان و ئاژەڵانیش) چونکە ستەمکردن دەبێتە مایەی تاریکی لەڕۆژی قیامەتدا، وە خۆشتان بپارێزن لە چاوچنۆکی، چونکە ئوممەتەکانی پێش ئێوەیان لەناوبرد، چاوچنۆکی وای لێکردن خوێنی یەکتربڕژن و حەرامکراوەکان حەڵاڵ بکەن.

هذا هو المسلم

## موسولمان دەبێت وابێت

٢٨-عَنْ عَبْد اللَّه بْن عَمْرِو بْنِ الْعَاص (رَضي الله عنه) عَنْ النَّبيِّ (صَلَى الله عَلَيه وَعَلَى آله وَسَلَم) قَالَ: الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِه وَيَدِه وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ. مُتَفَقٌ عَليه

واتە پێغەمبەریخوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلم) فەرمویەتی: موسوڵمان ئەوەیە کە موسوڵمانان لە زمان و دەستی پارێزراوبن (نەغەیبەتیان بکات و نەئازاریان بدات) وە کۆچبەریش ئەو کەسەیە کەپشت هەڵکات لەهەموو ئەوشتانەی خوایگەورە قەدەغەی کردوون.

المؤمن مصاب

## ئیماندار توشی نارەحەتی دەبێت

٢٩-عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلم): مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُصِبْ مِنْهُ.[1] رَوَاهُ البُخَارِيُّ

واتە پێغەمبەریخوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آلهِ وَسَلم) فەرمویەتی: خوایگەورە بۆ هەرکەسێکی ( موسوڵمان ) چاکەی بوێت، توشی بەڵاو موسیبەتی دەکات (بۆ ئەوەی لە تاوانەکانی پاك ببێتەوە).

جزاء القسوة

## سزای دڵ ڕەقی

٣٠-عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آلهِ وَسَلَم):« مَنْ لاَ يَرْحَمِ النَّاسَ لاَ يَرْحَمْهُ اللَّهُ ».مُتَفَقٌ عَلَيه

واتە پێغەمبەریخوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آلهِ وَسَلم) فەرمویەتی: هەرکەس بەزەیی بە خەڵکدا نەیەتەوە ئەوا خوایگەورەش بەزەیی بەودا نایەتەوە.

(1) قوله : يصب منه قال القاري : أي ابتلاه بالمصائب والأمراض.

من حقوق المسلم على اخيه

## له مافەكانی موسوڵمان بەسەر براكەیەوە

٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)قَالَ : حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ: رَدُّ السَّلَامِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ. مُتَّفَقٌ عَلَيهِ

واتە پێغەمبەری‌خوا(صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: مافی موسوڵمان بەسەر موسوڵمانەوە پێنج شتە، دەبێت ئەگەر سەلامی لێکرد وەڵامی بداتەوە، کە نەخۆش بوو سەردانی بکات، دوای مەیتەکەی بکەوێت بۆسەر قەبران، ئەگەر دەعوەتی کرد بچێت بەدەم دەعوەتەکەیەوە، ئەگەر پژمی و گوتی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ)(سوپاس بۆخوا) ئەمیش دەبێت وەڵامی بداتەوە بڵێت: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ)(خوا ڕەحمەت پێبکات).

المصلح ليس بكذاب

## ئەوەی تەبایی دەخاتە نێوان دووکەس درۆزن نییە

٣٢- عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعيط(رَضي الله عنها) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) يَقُولُ: لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمِي خَيْرًا، أَوْ يَقُولُ خَيْرًا. مُتَّفَقٌ عَلَيهِ

واتە پێغەمبەری‌خوا(صَلَّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: بەدرۆزن دانانرێت ئەوەی لەبەر ئاشتی خستنە نێوان خەڵکەوە قسەی خێر دەهێنێت و دەبات و (هەندێکیشی پێوە دەنێت ).[1]

(1) ئەمەیە کە پێی دەگوترێت "درۆی مەصلەحەت"بەواتای صولح و ئاشتی خستنە نێوان خەڵکەوە، نەك مەصلەحەت بەواتای سودو قازانج بەدەست هێنان بۆ کەسەکە، ئەگەر وابێت هیچ درۆیەك حەرام نییە چونکە زۆربەی درۆکان بۆ بەدەست هێنانی مەصلەحەتی شەخصییە. خوا پەنامان بدات لە درۆو سەرجەم تاوانەکانی تریش.

احفظ حق الجار

## مافی دراوسێ بپارێزه

٣٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضي الله عنهما) وعائيشة(رَضي الله عنها) قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللّه (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم): مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ. مُتَّفقٌ عَلَيه

واته پێغەمبەریخوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: جیبریل(سەلامی خوای لەسەر بێت) هێندە ئامۆژگاری دەکردم دەربارەی پاراستنی مافەکانی دراوسێ هەتا وام دەزانی دراوسێ میراتی دراوسێی بەردەکەوێت.

اجتنب الكبائر

## دور بکەوەروە لە تاوانە گەورەکان

٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو بْنِ العَاص(رَضي الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) قَالَ: الْكَبَائِرُ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ.[1] رَوَاهُ البُخَارِيُّ

واته پێغەمبەریخوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: (هەندێك لە) تاوانە هەرەگەورەکان ئەمانەن: هاوبەش بۆخوا بڕیاردان، ئازاردانی دایك و باوك، کوشتنی موسوڵمان، سوێنی درۆ.

أفش السلام

## سەلام بڵاو بکەرەوە

٣٥-عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم):« وَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ ».رَوَاهُ مُسْلِم

واته پێغەمبەریخوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەست، ناچنە بەهەشتەوە تا ئیمان نەهێنن، وە ئیمانداری ڕاستە قینە نین تا یەکتریتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر ئەنجامی بدەن خۆشەویستی بکەوێتە نێوانتان؟ سەلام لەیەکتری بکەن.

---

(1) هي التي يحلفها على أمر ماض كاذباً عالماً.

حُرمة الموحد

## رێزو حورمەتی کەسی یەکخواناس

٣٦-عَنْ أَبِي عبدالله طارق بن اشَيْم (رَضي الله عنه)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)يَقُولُ: « مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ، حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى ». رَوَاهُ مُسْلِم

واتە پێغەمبەری‌خوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: هەرکەس بڵێت: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) واتا(هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله) وە بێ باوەڕبێت بەهەموو ئەو شتانەی جگە لە الله دەپەرسترێن، ئەوا (لەم دنیادا) خوێن و ماڵی پارێزراوە وە (لەو دنیاش) حساب و کتابی کردەوەکانی بەدەست خوایە.

فضل التوحيد

## چاکەی یەکخوا پەرستی

٣٧- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامت (رَضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَانَّ الْجَنَّةَ حَقٌ وَالنَّارَ حَقٌّ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنْ الْعَمَلِ. مُتَّفَقٌ عَلَيه

واتە پێغەمبەری‌خوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)فەرمویەتی: هەرکەس شایەتی بدات بە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) واتا هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە الله نەبێت وە موحەمەد بەندەو نێردراوێتی، وە عیساش بەندەو نێردراوی الله یە، وشەیەکە بە مەریەمی گوتووە (وشەی کن واتا ببە) و لە ڕۆحی خۆیەتی، وە بەهەشت ڕاستەو هەیە، وە ئاگری دۆزەخیش ڕاستەو هەیە، خوای‌گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە هەرچەندە کردەوەی خراپیشی هەبێت. (تەوبەشی لێ نەکردبێت.)

المؤمن بين الخوف والرجاء

## ئیماندار له نێوانی ترس و ئومێدایه

٣٨- عن ابن مسعود(رَضي الله عنه) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم): الْجَنَّةُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ وَالنَّارُ مِثْلُ ذَلِكَ. [١] رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واته پێغەمبەری‌خوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: بەهەشت لە نەعل و پێڵاوەکانتان نزیکترە لێتانەوە (ئەگەر کاری بۆ بکەن بەدەستی دەهێنن) وە دۆزەخیش هەروا نزیکە (ئەگەر خۆتانی لێنەپارێزن خێرا بەرۆکتان دەگرێت).

احذروا الدنيا

## ئاگاداری -خرا پەی- دنیابن

٣٩-عَنْ أَبِى سَعِيد الْخُدْرِىِّ(رَضي الله عنه) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)« إِنَّ مِمَّا أَخَافُ عَلَيْكُمْ من بَعْدِي مَا يُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَزِينَتِهَا »[٢] مُتَفَقٌ عَلَيهِ

واته پێغەمبەری‌خوا (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: ئەوەی لەدوای خۆم دەترسم توشتان بێت (ببێتە مایەی دورخستنەوەتان لەدینەکەتان) خۆشی و ڕازاوەیی ئەم دنیایەیە (کە زۆر کورتەو بە خێراییش دەبڕێتەوە).

لا يبقى للمرء الا عمله

## مرۆڤ تەنها کردەوەکانی بۆ دەمێنێتەوە

٤٠-عَنْ أنس (رَضي الله عنه) عَنْ رَسُولُ اللَّه (صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) قَالَ: يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاثَةٌ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعمَلُهُ فيرْجعُ اثْنان ويَبْقَى وَاحِدٌ يَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عمَلُهُ. مُتَفَقٌ عَلَيه

واته پێغەمبەری‌خوا(صَلَىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: پاش مردن سێ شت دوای جەنازەی مرۆڤ دەکەوێت بۆ گۆڕستان: کەسوکاری و ماڵوسامانی و کردەوەکانی خۆی،

---

(1) شِرَاكِ نَعْلِهِ : هو السير الذي يكون على ظهر القدم في النعال( الحذاء) يعني ان الجنه قريبه مثل قرب هذا السير في النعال للقدم وهو ترغيب ،و ترهيب من قرب النار .

(2) زَهْرَةِ الدُّنْيَا هي زينة الحياة الدنيا ومتاعها الزائل وقيل زهرة للدلالة سرعة الفناء وقصر الحياة.

دوانیان تاسەرقەبران لەگەڵیدادەبن و دەگەڕێنەوە تەنهایەکێکیان لەگەڵیدا دەمێنێتەوە
کەسوکارو ماڵوسامانەکەی دەگەڕێنەوەو کردەوەکانی لەگەڵیدا دەمێنێتەوە.

## الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ

## ئەم دنیایە زیندانی ئیمانداره

٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَّم)«الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكَافِرِ». رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واتە پێغەمبەریخوا (صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَّم) فەرمویەتی: ئەم دنیایە وەک زیندان وایە بۆ ئیماندارو بەهەشتی بێباوەڕانە.

## البر والاثم

## چاکەو خراپە

٤٢- عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ،(رَضِي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَّم) قَالَ: «الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ».[1] رَوَاهُ مُسْلِمٍ

واتە پێغەمبەریخوا(صَلَّى الله عَلَيهِ وَعَلَى آله وَسَلَّم) فەرمویەتی: چاکە بریتیە لە ڕەوشت جوانی، خراپەش ئەو کردەوانەیە کاتێ (کەسی لەخواترس) ئەنجامیان بدات دڵی خوروی پێدابێت و حەزنەکات خەڵك پێی بزانێت. (بەڵام ئەم پێناسەیە بۆ کەسی لادەرو خراپەکار نییە، چونکە ئەو جۆرەکەسانە نەك دڵیان ناڕەحەت نابێ بەئەنجامدانی تاوان بەڵکو شانازیشی پێوە دەکەن).

---

(1) وأما أهل الفسق والفجور فإن الآثام لا تحيك بنفوسهم ولا يكرهون أن يطلع عليها الناس بل بعضهم يتبجح ويخبر بما يصنع من الفجور والفسق، ولكن الكلام مع الرجل المستقيم فإنه إذا هم بسيئة حاك ذلك في نفسه وكره أن يطلع الناس على ذلك، وهذا الميزان الذي ذكره النبي عليه الصلاة والسلام إنما يكون مع أهل الخير والصلاح .

## مَنْ يُحِبُّهُ اللهُ

## خوا كێی خۆشدەوێت

٤٣- عَنْ سَعْدِ بنِ أبي وَقّاصٍ(رَضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)يقول: « إنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ التَّقِيَّ الْغَنِيَّ الْخَفِيَّ ».[1] رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە پێغەمبەریخوا(صَلّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: خوایگەورە بەندەیەکی خۆش دەوێت ئەم سیفەتانەی تێدابێت: لەخواترس بێت و نەفس بەرز بێت و خۆپارێزبێت لەناوبانگ دەرکردن و زۆرترین کات بە کەموکوڕیەکانی خۆیەوە خەریکبێ.

## فضل الصدقة والتواضع

## سودی ماڵبەخشین و خۆبەکەم زانین

٤٤- عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ(رَضي الله عنه): عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)قَالَ: « مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلاَّ عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ ». رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە پێغەمبەریخوا(صَلّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم) فەرمویەتی: هەرزگیز ماڵوسامان بە بەخشین کەم ناکات، وە خوایگەورە بەندە لێبوردەکانی خۆی ڕێزداردەکات، هەرکەسیش لەبەرخوا خۆی بەکەم نیشان بدات و فیزی نەبێت ئیللا خوایگەورە (لەبەرچاوی خەڵك) بەرزی دەکاتەوە.

## كن رفيقاً

## نەرمونیان بە

٤٥- عَنْ عَائِشَةَ(رَضي الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّىَ الله عَلَيهِ وَعَلَىَ آله وَسَلَم)قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ، وَمَا لاَ يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ ». رَوَاهُ مُسْلِمٌ

---

(1) الخفى : الخامل المنقطع إلى العبادة والاشتغال بأمور نفسه.

